٢

# ڕێبەری پزیشکی
## بۆ نەخۆش لەمانگی ڕەمەزاندا


نوسینی

د.حسان شمسی پاشا

وەرگێڕانی

باوکی موحەممەد

پێداچوونەوەی

مامۆستا ناصح شارباژێری




زنجیرەی بابەتە (زانستیە - فیقهییەکانی سەردەم
٢

# ڕێبەری پزیشکیی بۆ نەخۆش لە مانگی ڕەمەزاندا

وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ
يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ

نوسینی : د.حسان شمسی پاشا

وەرگێڕانی
باوکی موحەممەد

پێداچوونەوەی
مامۆستا ناصح شاربازێری

ناوی کتێب : ڕێبەری پزیشکیی بۆ نەخۆش لە مانگی ڕەمەزاندا
نوسینی: د.حسان شمسی پاشا
وەرگێڕانی: باوکی موحەممەد (جەلال کەریم)
پێداچونەوەی: مامۆستا ناصح شارباژێری
دیزاین: کۆمپیوتەری سارا
تیراژ: ١٠٠٠دانە
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٧٠٥ )ی ساڵی (٢٠١١) ی پێدراوە.
چاپخانەی : ڕێ نوێ - سلێمانی

## پێرست

**بابەت** | **لاپەڕە**

# پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله و على اله و صحبه ومن والاه ...اما بعد..

خوێنەری کورد زوبانی بەڕێز...زۆرن ئەو بابەتانەی دەربارەی مانگی ڕەمەزان نووسراون وەکو مەرج و پێویستیی و سوننەت و بەتاڵکەرەوەکانی ڕۆژووگرتن بەڵام کەمن ئەو بابەتانەی کە باس لە ڕۆژووگرتنی نەخۆشەکان لە مانگی ڕەمەزاندا بکەن بە تایبەتی نوسراوێکی گشتگیر و کۆکەرەوە کە باس لە زۆربەی زۆری نەخۆشیە باوەکانی سەردەم بکات و دواتر لەڕووی شەرعەوە هەڵسەنگاندنیان بۆ بکات : ئایا کەسی تووشبوو بەیەکێك لەم نەخۆشیانە دەتوانێت بەرۆژوو ببێت یان نا ؟

بێگومان ئەم هەڵسەنگاندنەش تەنها بە پزیشکێکی پسپۆڕ ناکرێت ئەگەر مسوڵمان و لەخواترس نەبێت، یاخود تەنها بە مامۆستا و زانایەکی ئایینی ناکرێت ئەگەر پرس و ڕاوێژ بە پزیشکێکی پسپۆڕ نەکات بۆ بڕیاردانی ڕۆژووگرتن یان نەگرتنی نەخۆش لە مانگی ڕەمەزاندا.

لەم سۆنگەیەوە بە پێویستم زانی کە بابەتێکی لەم جۆرە وەرگێڕمە سەر زوبانی کوردی ، بە تایبەتی کە نووسەر پزیشکێکی مسوڵمانی خەڵکی وولاتی سوریایە و ئەگەر تێبینی بکرێت چەندەها بابەتی گرنگ و سەردەمیانەی (پزیشکیی – ئایینی) تری هەیە لە سایتەکەی خۆیدا لە ئینتەرنێت ، کە سەرجەمیان لەخزمەتی مسوڵمانانداان بە ساغ و نەخۆشەوە.

بەهیوای سوود گەیاندن بە خوێنەری بەڕێز و پڕکردنەوەی کەلێنێکی تری کتێبخانەی کوردی ، لەگەڵ داوای دوعای خێر لە بەڕێزتان.

٢٠ / جەمادی یەکەم / ١٤٣٢ ك

٢٥ / نیسان / ٢٠١١ ز

# تێبینی

١-جیاوازی نێوان نەخۆشی توند (حاد) و درێژخایەن (مُزمن) ئەوەیە:

أ-نەخۆشی توند ماوەی تووشبونەکەی کورت و خێرایە ، بەلاّم درێژ خایەن ماوەکەی درێژە.

ب-نەخۆشی توند نیشانەکانی توند و قورسن بەلاّم مەرج نیە درێژ خایەن وابێت.

٢-ئەم کتێبە تەنها بەرچاو ڕوونییە بۆ نەخۆش بۆ ئەوەی زانیاریەکی تەواوی هەبێت دەربارەی نەخۆشیەکەی و قۆناغەکانی و حاڵەتەکانی ، وە هەرگیز بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە نەخۆش ناتوانێت بڕیاری کۆتایی خۆی بدات دەربارەی ڕۆژوو گرتن یان نەگرتنی ، بەڵکو پێویستە پرسیار لە مامۆستایەکی ئایینی بکات کە ئەویش بە ڕاوێژ لەگەڵ پزیشکێکی پسپۆڕدا دەتوانن ئەو بڕیارە بدەن ، یاخود پزیشکێکی مسوڵمان کە زانیاری پێویستی دەربارەی ئایین هەبێت جگە لە پسپۆڕییەکەی خۆی.

## ﴿ ڕێبەری پزیشکیی بۆ نەخۆش لە مانگی ڕەمەزاندا ﴾

لەگەڵ هەموو هاتنەوەیەکی مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا ، زۆر لە نەخۆشەکان پرسیار دەکەن ، ئایا دەتوانن ڕۆژوو بگرن ، یان نا؟ ئایا ڕۆژوو گرتن نەخۆشیەکەیان قورس دەکات؟ یاخود نیشانەکانی نەخۆشییان ئاڵۆزتر دەبێت یان نا؟ پرسیار گەلێکی زۆرن کە بە مێشکی نەخۆشەکان و کەس و کاریاندا دێت ، جا هەندێك کەس دەبێتە قوربانی خەیاڵ ، یان نەزانێك فەتوای بۆ دەدات کە شارەزایی لە پزیشکیدا نیە ، بەڵام دروستتر ئەوەیە پزیشکێکی مسوڵمانی تایبەتمەند حاڵەتی نەخۆشەکە دەستنیشان بکات و ڕێنمایی و بەرچاو ڕوونی تەواوی بداتێ.

زۆر لە نەخۆشەکان دەیانەوێت بەڕۆژوو بن و ناتوانن یاخود ڕۆژووەکە دەبێتە بارگرانی لەسەر نەخۆشیەکەیان یان نیشانەکانیان ئاڵۆز دەکات ، وە ڕای پزیشکیی زۆر هەبوون لەسەر ئەم بابەتە بەڵام زۆربەیان لە ئەنجامی شارەزایی تاکە کەسییەوە بوون یان لە شێوەی ووتار لێرە و لەوێ بڵاوبوونەتەوە ، بەداخەوە تا ئێستا — لەسنوری زانیاری مندا — وانەیەك لە کۆلێژی پزیشکیدا نیە بەناونیشانی (ڕۆژوو و کاریگەریەکانی بەسەر نەخۆشیە جیاوازەکانەوە) .

هەروەها هیچ سەرچاوەیەکی پزیشکیی نیە کە هەموو لێکۆڵینەوە زانستیەکان لەخۆبگرێت کە لە گۆڤارە پزیشکیەکاندا بڵاوکراونەتەوە

بە ئەمریکی و ئەوروپی و عەرەبیەوە کە پەیوەندیدارن بە ڕۆژوو گرتنەوە ، وە تا چەند ساڵێك پێش ئێستا تەنها ژمارەیەکی کەم لەو لێکۆڵینەوانە لەبەر دەست دا هەبوون.

بەڕاستی دواتر خۆشحاڵبووم کە چەند لێکۆڵینەوەیەکی زانستی نوێم بەردەست کەوت دەربارەی ڕۆژووگرتن لەچەند گۆڤارێکی پزیشکیی جیهانیدا ، یەکێك لەوانە لە گۆڤاری (B.M.J)ی بەریتانی دا بوو دەربارەی (ڕۆژووگرتن و نەخۆشانی شەکرە) یەکێکی تر لە بارەی کاریگەری ڕۆژوو لەسەر منداڵبوون ، کاریگەری ڕۆژوو لەسەر نەخۆشانی پەککەوتەی گورچیلە ...هتد، وە چەندەها بابەتی زانستیی نوێ و ڕاسپاردەی شارەزایان لەو بوارانەدا.

هەر لەبەر ئەمەش هەستام بە دانانی کتێبی (ڕێبەری پزیشکیی و فیقهی بۆ نەخۆش لە مانگی ڕەمەزاندا) کە لە ژێر چاپدایە و چاوەڕێی ڕووناکی دەکات ، وە بە باشم زانی کورتەیەکی بخەمە بەردەستتان ، وە ئەم پوختەیە تەنها کۆمەڵێك ڕاسپاردە و ئامۆژگاری گشتین و ناکرێت بەسەر هەموو نەخۆشێکدا جێبەجێ بکرێت بەڵکو پێویستە پزیشکێکی تایبەتمەندی مسوڵمان هەڵسەنگاندن و ئامۆژگاری بکات بۆ نەخۆش چونکە ئەو زاناترە بە حاڵی نەخۆشەکە.

د.حسان شمسی پاشا

## یەکـــەم : نەخۆشـــی کۆئەنـــدامی هـــەرس لـــە مانگی ڕەمەزاندا

بەراستی مانگی ڕەمەزان ، مانگی پشوودانی کۆئەندامی هەرسە ، بەڵام بەداخەوە زۆربەمان خۆی ئەچەرێنیّ لەکاتی بەربانگدا بە جۆرەها خواردن و خواردنەوە ، وە خۆشحاڵی گەدە و ڕیخۆڵەکانی دەکاتە مایەی ئاوساوی و بارگرانی ، ئێستاش چەند نەخۆشیەکی گرنگ دەخەینە ڕوو کە پەیوەندیان بە ڕۆژووگرتنەوە هەیە :

**١- برینی گەدە یان دوانزە گریّ (قرحة المعدة أو الاثنى عشر) :**

ئەو کەسەی برینی توندی هەبێت دەناڵێنیّ بەدەست ئازاری گەدەوە لە کاتی برسێتیدا ، یان ئازارەکە لە خەودا بە ئاگای دەهێنێت ، ئەگەر چی برینی دوانزە گریّ سووکتر دەبێت بە نانخواردن ، بەڵام دوای چەند کاتژمێرێك ئازارەکە دەگەڕێتەوە ، وە پێویستە لەسەر نەخۆشی تووشبوو بە یەکێك لەم حاڵەتانەی خوارەوە ، ڕۆژوو بشکێنێت (یان بەڕۆژوو نەبێت):

أ-برینی توند : ئەو کاتەی نەخۆش نیشانەکانی برینی لیّ دەردەکەوێت ، وەکو ئازار لەکاتی برسێتیدا ، یان بە ئاگا هاتنەوە بە هۆی ئازارەوە.

ب-لەکاتی هەڵگەڕانەوەی توند لە برینی درێژ خایەندا وەکو لە برینی تونددا ڕوو دەدات ، بەهەمان شێوە لەو کەسانەدا کە

نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە تیایاندا بەردەوامە لەگەڵ بەکارهێنانی دەرماندا بەرێکوپێکی .

ج-لەکاتی ڕوودانی دەرهاویشتەکانی برینی گەدە و دوانزەگرێ ، وەکو خوێن بەربوونی کۆئەندامی هەرس ، یان چاکنەبوونەوەی برینەکە لەگەڵ ئەوەشدا کە بەردەوام چارەسەری دەرمانی بۆ ئەنجام بدرێت.

٢-گران هەرس کردن (عسر الهضم) :

کۆمەڵە نیشانەیەکن لەدوای نان خواردنەوە دەردەکەون ، لەوانە ژانەسك ، هەوا و گازی ناوسك ، قرقێنە ، دڵتێکهەڵاتن ، هەستکردن بە ناڕەحەتی لە سەرووی سکەوە ، بەتایبەتی لە دوای خواردنی ژەمێکی قورس ، یان دوای بەپەلە نان خواردن ، یان دوای خواردنی چەور و پڕ لە بەهارات .

خۆشبەختانە زۆربەی ئەم حاڵەتانەی سەرەوە بە ڕۆژوو گرتن چاك دەبنەوە بەمەرجێك کەسەکە برینی گەدە و دوانزەگرێی توند ، یان هەوکردنی سورێنچکی نەبێت ، هەروەها بەو مەرجەی زیادەڕەوی نەکات لە خواردن و خواردنەوە لەکاتی بەربانگ و پارشێوکردندا.

### ٣-هەڵدڕینگی گەدە (فتق المعدە او الحجاب الحاجز) :

ئەمیش بە تایبەتی لە قەڵەوەکاندا ڕوو دەدات بە تایبەتیتر لە ئافرەتانی تەمەن ناوەندا ، وە ئەم حاڵەتەش لە زۆربەی تووشبواندا هیچ نیشانەیەکی نیە جگە لە هەندێك کەس کە هەست بە سوتانەوە و ترشی دەکەن لە گەدەیاندا ، بەتایبەتی لە کاتی پڕبوونی گەدەدا ، یان چەمینەوەی کەسەکە بۆ پێشەوە ، یان ڕاکشانی لەسەر پشت ، لەو کاتەدا بەشێك لەوەی لەناو گەدەدا هەیە دەگەڕێتەوە بۆسورێنچك.

پێویستە لەسەر قەڵەوەکان چەندیان لە تواناداية کێشی خۆیان کەم بکەنەوە ، چونکە باشترین چارەسەرە بۆ حاڵەتەکەیان ، وە ئامۆژگاری ئەم نەخۆشانە دەکرێت کە لە کاتی بەربانگ و پارشێودا بڕی کەم بخۆن ، لەگەڵ بەکارهێنانی دەرمانەکانیاندا ، هەروەها چەوری کەم بکەنەوە و جگەرە بە هیچ شێوەیەك نەخۆن ، وە پێویستە ماوەی نێوان ژەمێکی خواردن و نووستنیاندا (چوار) کاتژمێرێك بێت.

بەڵام ئەگەر ڕۆژووگرتن سەغڵەتیی بۆ ئەم جۆرە نەخۆشانە دروستکرد یان نیشانەکانی نەخۆشیەکەیانی قورستر دەکرد ئەوا درووستە بەڕۆژوو نەبن .

**٤-سکچوون (الاسهال) :**

ئەو کەسەی سکچوونی هەیە ئامۆژگاری دەکرێت بەوەی کە بەڕۆژوو نەبێت بەتایبەتی لەکاتی سکچوونی قورسدا ، چونکە نەخۆشەکە توانای ڕۆژوو گرتنی نامێنێت ، بەهۆی جێنەگرتنەوەی ئەو شلە و خوێیانەی لە سکچوونەکەدا لەدەستی دەدات ، وە ئەگەر ئەم تووشبووە بەڕۆژوو بێت ئەوا تووشی وشکبوونەوە و دابەزینی فشاری خوێن دەبێت یان تووشی لەکارکەوتنی گورچیلە دەبێت .

**٥-نەخۆشیەکانی جگەر:**

وەکو بە مۆمبوونی جگەر (تشمع الكبد) و گرێکانی جگەر (اورام الكبد) ، ئەمانیش ئامۆژگاری دەکرێن بەڕۆژوو نەگرتن ، هەروەها ئەوانەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسییان هەیە لە جۆری توند (التهاب الكبد الفايروسي الحاد) ، وە ئەوانەی ئاوبەندی سکیان هەیە (الحبن او الاستقاء في البطن).

***٦-نەشتەرگەریەکانی لێکردنەوەی گەدە (عملیت إستئصال المعده) :***

هەندێك نەخۆش هەیە نەشتەرگەری بڕین و لێکردنەوەی بەشێك لە گەدەی بۆ ئەنجام دراوە بەهۆی برینی گەدەوە (قرحة المعدة) وە پێویستی بە وە هەیە کەم خۆری بەردەوام خۆربێت لەبەر ئەوە ناتوانێت بەڕۆژووبێت.

## دووەم : نەخۆشی دڵ لە مانگی ڕەمەزاندا

بێگومان ڕۆژووگرتن سوودێکی زۆری بۆ زۆربەی نەخشەکانی دڵ هەیە ، بەڵام هەندێك حاڵەتی دیاریکراو هەیە نەخۆش ناتوانێت تیایدا بەڕۆژووبێت :

### ١-بەرزی پەستانی خوێن:

ڕۆژوو سوودی بۆ چارەسەری بەرزی پەستانی خوێن هەیە و دابەزینی کێش لەگەڵ ڕۆژووگرتندا دەبێتە هۆی دابەزینی پەستانی خوێن بە شێوەیەکی بەرچاو جگە لەوەش وەرزشە لاشەییەکانیش – کە خۆی دەبینێتەوە لە نوێژی تراویح و شەونوێژدا – بەرزی پەستانی خوێن دادەبەزێنن.

ئەگەر فشاری خوێنەکە لە ژێر کۆنترۆڵدابوو بەهۆی دەرمانەوە ، ئەوا نەخۆشەکە دەتوانێت بەڕۆژوو ببێت بەمەرجێك دەرمانەکانی بە ڕێکوپێکی بخوات ، چونکە ئێستا دەرمانی وا هەیە بۆ دابەزینی فشاری خوێن ڕۆژانە جارێك یان دووان دەخورێت .

### ٢-سستی دڵ (فشل القلب او قصور القلب):

ئەویش دوو جۆرە ، سستی لای چەپی دڵ ، سستی لای ڕاستی دڵ ، لە هەردوو بارەکەدا نەخۆش هەست بە تەنگە نەفەسی دەکات لە ئەنجامی هەستان بە کارێك ، بەڵکو لەکاتی پشوودانیشدا ، ئامۆژگاری تووشبوو بە سستیی توندی دڵ دەکرێت کە بەڕۆژوو

نەبێت ، چونکە بەردەوام پێویستی بە دەرمانی (میز پێکەر) هەیە لەگەڵ دەرمانی (بەهێزکەری ماسولکەکانی دڵ) ، بەڵکو لەوانەیە پێویستی بە چارەسەرکردن هەبێت لە نەخۆشخانەدا.

بەڵام ئەگەر حاڵەتی نەخۆشەکە باشتربوو و باری تەندروستی جێگیر بوو ، وە بڕێکی کەم لە دەرمانی میز پێکەری دەخوارد ، ئەوا دەتوانێت بەڕۆژوو بێت.

هەروەها پێویستە نەخۆش ڕاوێژ بە پزیشکێکی موسوڵمان بکات کە تایبەتمەند بێت لە نەخۆشیەکانی دڵدا ، چونکە تەنها ئەو دەتوانێت بڕیار بدات نەخۆشەکە بەڕۆژوو ببێت یان نا؟ لەبەر ئەوەی ئەم مەسەلەیە پەیوەندی هەیە بە سووکی و قورسی نەخۆشیەکە و بڕی ئەو دەرمانە میزپێکەرەی کە پێویستی پێیەتی.

**٣-سنگە گوژێ (الذبحة الصدرية):**

سنگە گوژێ بەهۆی تەسکبوونەوەی خوێنبەری تاجییەوە ڕوودەدات کە خۆراك دەگەیەنێتە ماسولکەی دڵ ، ئەگەر نیشانەکانی نەخۆش جێگیربوون بەهۆی خواردنی دەرمانەوە ، و نەخۆش هیچ ئازارێك لە سنگیدا نەبوو ، ئەوا دەتوانێت بەڕۆژوو ببێت دوای سەردانکردنەوەی پزیشکەکەی بۆ دڵنیابوون لە گۆڕانکاری لە وەرگرتن و خواردنی دەرمانەکان.

بەڵام ئەوانەی سنگە گوژێی ناجێگیریان هەیە یان پێویستیان بە خواردنی خەپلەی (نایترۆگلیسرین) کە لە ڕۆژدا لەژێر زماندا

دەهێڵرێتەوە ، ئەوا ئامۆژگاری دەکرێن بە ڕۆژوو نەگرتن ، وە پێویستە سەردانی پزیشکی خۆیان بکەن بۆ دیاریکردنی پلانی چارەسەرەکە.

***٤-جەڵتەی دڵ (جلطة القلب او احتشاء العضلة القلبية):***

ڕوودەدات لە ئەنجامی گیرانی یەکێك لە خوێنبەرە تاجییەکانی دڵ ، ئەمیش دەبێتە هۆی مردنی ئەو خانانەی دەکەونە شوێنە تووشبووەکەی دڵ ، ئەوانەی تازە تووشی جەڵتەی دڵ بوونە (بەتایبەتی شەش هەفتەی یەکەم) ئامۆژگاری دەکرێن بە نەگرتنی ڕۆژوو ، بەڵام ئەگەر نەخۆشەکە بەرەو چاکبوونەوە ڕۆیشت ، وە کەوتە سەر باری ئاسایی خۆی ئەوا دەتوانێت بەڕۆژوو ببێت بەمەرجێك بە ڕێکوپێکی دەرمانەکانی بخوات.

**٥-نەخۆشیەکانی دەرچەکانی دڵ (امراض صمامات القلب) :**

کە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تووشبوونی دەرچەکانی دڵ بە تای ڕۆماتیزمی (الحمى الروماتزمية) لە سەردەمی منداڵیدا ، دەبێتە هۆی تەسکبوونەوە و بچوکبوونەوەی دەرچەکە لە ئەنجامی تێکچوونی پەڕەکانی دەرچەکە ، وە ئەگەر حاڵەتی نەخۆشەکە جێگیر بوو ، و هیچ نیشانەیەکی نەبوو ئەوا دەتوانێت بەڕۆژوو ببێت ، بەڵام ئەگەر نەخۆشەکە تەنگە نەفەسیی هەبوو وە بەردەوام پێویستی بە دەرمانی میز پێکەر بوو ئەوا باشترە ڕۆژوو نەگرێت .

**٦-كێن ئەو کەسانەی کە نەخۆشی دڵیان هەیە و ئامۆژگاری دەکرێن بە ڕۆژوو نەگرتن ؟**

*تووشبوان بە سستی دڵی ناجێگیر .

*سنگە کوژێی نا جێگیر ، یاخود وەڵامدەر بۆ چارەسەر.

*جەڵتەی دڵی تازە تووشبوو .

*تەسکبوونەوە و سستیی توندی دەرچەکانی دڵ.

*تای ڕۆماتیزمی چالاک .

*پەشێویە ترسناکەکانی سستمی دڵ.

*چەند هەفتەیەك دوای ئەنجامدانی نەشتەرگەری دڵ.

## سێیەم : نەخۆشی گورچیلە لە مانگی ڕەمەزاندا

گورچیلەکان چەندەها فەرمانیان هەیە ، لەوانە پاڵفتەکردنی خوێن لە پاشەڕۆ نایترۆجینیەکان و چاودێری کردنی هاوسەنگی ئاو و ئایۆنەکان لە خوێندا ، هەروەها پاراستنی هاوسەنگی ( تفتی – ترشی )ی جێگیر لە لەشدا ، وە ئەگەر گورچیلەکان ساغ بن ئەوا ڕۆژووگرتن بۆیان پشبوودان و سەلامەتیە ، بەڵام ئەگەر نەخۆش بن ، ئەوا ناتوانن هەستن بە کاری خەستکردنەوەی میز و لەکۆڵکردنەوەی ماددە ژەهراویەکانی وەکو یوریا و ئەوانی تر.

کەواتە : ڕۆژووگرتن دەبێتە بارگرانی بۆ نەخۆشی سستیی گورچیلە بەتایبەتی لە ناوچە گەرمەکاندا کە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی (یوریا و کریاتنین) لە خوێنیدا .

پێویستە لەسەر کەسی توشبوو بە نەخۆشی گورچیلە ڕاوێژ بە پزیشکی تایبەتی خۆی بکات پێش ئەوەی دەست بکات بە ڕۆژووگرتن ، ئەگەر ئەم جۆرە نەخۆشە بڕی پێویست ئاو نەخواتەوە ئەوا تووشی سستیی گورچیلەکان دەبێت .

### ١-حاڵەتە توندەکانی نەخۆشیەکانی گورچیلە :

لەوانەیە وا پێویست بکات ئەو کەسەی توشی نەخۆشیەکی توندی گورچیلە بووە ، لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە بۆ چارەسەر وەرگرتن ، لەم حاڵەتەدا وا باشترە نەخۆش بەڕۆژوو نەبێت ، بۆ نمونە هەوکردنی

حەوزی گورچیلە و هەوکردنی توندی گورچیلە ، هەوکردنی توندی میزەڵدان و قوڵنجکردنی گورچیلە ، و هەوکردنی گلۆڵەکانی گورچیلە

**٢-بەردی گورچیلە ( الحصيات الكلويه ) :**

ئەگەر کەسێك پێشتر بەردی گورچیلەی نەبوبێت ئەوا پێویست ناکات لە مانگی ڕەمەزاندا توشی دڵەراوکێ ببێت ، بەڵام ئەوانەی بەردی گورچیلەیان هەبووە یان چەند جارێك درووستیانکردۆتەوە ، ئەوا حاڵەتیان خراپتر دەبێت بە وشکبوونەوە ئەگەر نەخۆش بڕی پێویست لە شلەمەنی نەخواتەوە.

وا باشترە بۆ نەخۆشی بەردی گورچیلە کە بەڕۆژوو نەبێت بە تایبەتی لە ڕۆژە زۆر گەرمەکاندا چونکە بڕی میز کەم دەبێتەوە بە پلەیەکی بەرچاو ، ئەمەش یارمەتیدەرە بۆ زۆربوونی قەبارەی بەردەکان ، هەڵسەنگاندنی حاڵەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ پزیشکی تایبەتمەند ، و بە شێوەیەکی گشتی ئامۆژگاری نەخۆشانی بەردی گورچیلە دەکرێت بە خواردنەوەی بڕێکی زۆر لە شلەمەنیەکان لە کاتی بەربانگ و پارشێودا لەگەڵ خۆ دوورخستنەوە لە گەرما و ماندووبونی زۆر لەکاتی ڕۆژودا.

٣-هەوكردنى حەوزى گورچيلە و هەوكردنى گورچيلەى درێژخايەن (المزمن):

كە لەوانەيە دواى ماوەيەك ببێتە هۆى ڕوودانى سستيى گورچيلە ، لەبەر ئەوە وا باشترە نەخۆشەكە بەڕۆژوو نەبێت ، چونكە گريمانەى تووشبوون بە نەخۆشى سستيى گورچيلە زۆرتر دەبێت ، و ئەو بڕيارەش دەگەڕێتەوە بۆ پزيشكى چارەسەركەر .

٤-هەوكردنى گلۆڵەكانى گورچيلە و هەوكردنى گورچيلەى درێژخايەن:

لەم بارەشدا گورچيلەكان توشى تێكچوون دەبن لە فەرمانەكانياندا كە لەوانەيە ببێتە هۆى حاڵەتى (التناذر الكلوي) كە تووشبوو هەردوو لاقى دەئاوسێن و ماددەى (ئەلبۆمين)ى خوێن كەم دەكات و بڕێكى زۆر لە پرۆتين لە ميزدا دەردەكەوێت ، ئەم حاڵەتى (التناذر الكلوي) لەگەڵدا بوو ، يان بەرزبوونەوەى پەستانى خوێن يان سستى گورچيلەى لەگەڵدابوو.

٥-سستيى گورچيلەى درێژخايەن (الفشل الكلوي المزمن) :

هەندێك لە نەخۆشيەكانى گورچيلە بە چەند قۆناغێكدا تێپەردەبن كە كۆتاييان دێت بە سستيى گورچيلەى درێژ خايەن ، ئەويش لە كاتێكدايە كە بەشێكى زۆر لە شانەكانى گورچيلەكان وێران دەبن ، وە

لەم کاتەدا نەخۆش دەناڵێنێ بەدەست شەکەتی و ماندوێتی و زۆر میزکردن و بەشەو میزکردن و تینوێتی ، وە لەم حاڵەتەدا ڕێژەی ( هەردوو ماددەی یوریا و کریاتنین) بەرز دەبێتەوە ، و پۆتاسیۆمی خوێن زۆر دەبێت ، بۆیە ئامۆژگاری نەخۆشی گورچیلەی درێژخایەن دەکرێت بەنەگرتنی ڕۆژوو ، بەڵام ئەگەر نەخۆشەکە شتنەوەی گورچیلەی هەبوو ، ئەوا دەتوانێت ئەو ڕۆژەی شتنەوەی گورچیلەی نیە بەڕۆژوو ببێت وە ئەو ڕۆژەی شتنەوەکەی هەیە بە ڕۆژوو نەبێت ، وە پێویستە نەخۆش ڕاوێژ بە پزیشکی تایبەتی خۆی بکات.

## چوارەم : نەخۆشی شەکرە لە مانگی ڕەمەزاندا

دوو جۆر نەخۆشی شەکرە هەیە، جۆرێکیان دەکرێت بە ڕۆژوو بن، جۆرێکی تریان نابێت بە ڕۆژوو بن :

***١-ئەو کەسەی نەخۆشی شەکرەی هەیە و دەتوانێت بە ڕۆژوو ببێت، وەکو :***

أ-نەخۆشی شەکرەی پێگەیشتوو کە بە ڕێجیمی خۆراکی پارێز دەکات .

ب-ئەو کەسەی نەخۆشی شەکرەی هەیە و بە خەپلەی کەمکردنەوەی شەکرەی خوێن پارێز دەکات ئەویش دوو جۆرن:

**یەکەم:** ئەوانەی ڕۆژانە یەك دەنك خەپلە دەخۆن ، بە ئاسایی دەتوانن بەڕۆژوو بن ، بەمەرجێك لە بەربانگدا ڕاستەوخۆ بە دوو سێ دەنك خورما و پەرداخێك ئاو ڕۆژووەکەیان بشکێنن وە دواتر دەرمانەکەیان بخۆن پاشان خواردنی ژەمی ئێوارە بخۆن.

**دووەم:** ئەوانەی ڕۆژانە دوو دەنك خەپلە دەخۆن : ئاسایی دەتوانن بەڕۆژوو بن ، بەمەرجێك ئەو خەپلەیەی لە پێش مانگی ڕەمەزان خواردبێت ، بەهەمان شێوە بۆ زیاتر لە دوو خەپلە ، واتە بنەما ئەوەیە بڕی خەپلەی پێش پارشێو کەمبکرێتەوە بە پشت بەستن بە ئامۆژگاری پزیشکی چارەسەرساز.

## ٢-ئەو نەخۆشی شەکرەیەی ناتوانێت بەڕۆژوو ببێت :

١/نەخۆشی شەکرەی گەنجانە (لە ژێر تەمەنی (٣٠) ساڵیەوە).

٢/نەخۆشی شەکرەی پێویست بە بڕی زۆر هۆرمۆنی ئەنسۆلین (زیاتر لە چل یەکەی نێو دەوڵەتی ڕۆژانە) یان ئەوانەی ڕۆژانە دووجار ئەنسۆلین وەردەگرن.

٣/نەخۆشی شەکرەی نا جێگیر.

٤/ئافرەتی سکپڕی تووشبوو بە نەخۆشی شەکرە.

٥/پیری تووشبوو بە شەکرە بۆ چەند ساڵێك ، لە هەمان کاتدا دەناڵێنێ بەدەست نیشانەکانی شەکرەی پێشکەوتووەوە.

٦/ئەو نەخۆشەی بە چەند ڕۆژێك پێش یان لە سەرەتای مانگی ڕەمەزاندا تووشی نەخۆشی شەکرە بووە.

***بۆیە پێویستە ئەم ڕاستیانەی لای خوارەوە لەبەرچاو بگرین:***

١-پێویستە لەسەر ئەو نەخۆشەی کە تووشی حاڵەتی کەم شەکری یان زۆر شەکری دەبێت ڕاستەوخۆ ڕۆژوو گرتنەکەی ڕابگرێت چونکە پێویستی بە چارەسەر و دەرمانی خێرا هەیە .

٢-پێویستە ژەمەکان بکرێن بە سێ بەشی یەکسانەوە ، یەکەم: لەکاتی بەربانگ دا ، دووەم : لە دوای نوێژی تەراویح ، سێیەم : لە کاتی پارشێو کردندا .

٣–وا باشتره ژەمی پارشێو دوابخرێت بە پێی توانا .

٤–زۆرخۆری نەکرێت بەتایبەتی لە شیرینی و شلەمەنیە شیرینەکاندا ، و بە شێوەیەکی گشتی رێگەدان یان نەدان بە نەخۆشی شەکرە لەگەڵ رێکخستنی دەرمان و کاتی خواردنەکەی دەگەرێتەوە بۆ پزیشکی تایبەت نەك کەسێکی تر.

## پێنجـەم : نەخۆشـی سـنگ ( سـییەكان ) لـە مـانگی ڕەمەزاندا

زۆربەی جارەكان نەخۆشیەكانی سنگ بە شێوەی كتوپڕی دەردەكەون لەسەر شێوەی هەوكردنی بۆریەكانی هەوا یان هەوكردنی سییەكان.

**١-هەوكردنی بۆریەكانی هەوای توند ( التهاب القصبات الحاد ):**

ئەگەر حاڵەتەكە سادەبوو دەرمانی دژە میكرۆبی بوو كە پێوستە هەموو (٦ – ٨) كاتژمێر جارێك بخورێت ، یان حاڵەتەكەی توند و قورس بوو ، ئەوا باشتر وایە بەرۆژوو نەبێت تا چاكدەبێتەوە لە هەوكردنەكە.

**٢-هەوكردنی بۆریەكانی هەوای درێژخایەن (التهاب القصبات المزمن):**

لەم بارەدا نەخۆش دەناڵێنێ بەدەست كۆكە و بەڵغەمەوە ، ڕۆژانە بۆ ماوەی (٣) مانگ لەسەر یەك تا ماوەی دوو ساڵ بە دوای یەكدا بە لایەنی كەمەوە ، ئەگەر حاڵەتەكەی جێگیر بوو ئەوا دەتوانێت بەڕۆژوو ببێت بەبێ ماندووبوون ، بەڵام لە حاڵەتە توندەكاندا كە پێویستی بە دەرمانی دژە میكرۆبی یان فراوانكەری بۆریەكانی هەوا یان پەمپ (بخاخ)ی فراوانكەری بۆریەكانی هەوا دەبێت ، ئەوا لەم كاتانەدا

پزیشك دەتوانێت دیاری بكات ئایا ئەم نەخۆشە دەتوانێت بەرۆژوو ببێت یان نا.

**٣-بەرهەنگ (الربو القصبی):**

جاری وا هەیە نۆرەكانی بەرهەنگ سووكن و پێویستیان بە خواردنی دەرمان نیە لەڕێی دەمەوە , وە دەتوانێت خەپلەی وا بخوات لەكاتی بەربانگ و پارشێودا كە كاریگەریەكەی ماوە درێژ بێت ، زۆر لە نەخۆشەكانی بەرهەنگ پێویستیان بە دووجار یان زیاترە لە بەكارهێنانی پەمپی فراوانكەر ، لەكاتی هەستكردن بە تەنگەنەفەسی لە سنگدا ، دواتر نەخۆشەكە دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئاسایی ڕۆژانەی خۆی ، و نابێت نەخۆش لەكاتی بوونی كێشەیەكی تەنگەنەفەسیدا بەردەوام بێت لە ڕۆژووگرتن ، بەڵكو دەبێت ڕاستەوخۆ پەمپەكە بەكاربهێنێت ،هەروەها هەندێك زانای بەڕێزیش فەتوای ئەوەیان داوە كە ئەم پەمپە ڕۆژوو ناشكێنێت ، بەڵام لەكاتی نۆرەیەكی تەنگە نەفەسی قورسدا هەردەبێت نەخۆشەكە ڕۆژووەكەی بشكێنێت چونكە زۆربەی جارەكان پێویستی بە رۆیشتنە نەخۆشخانە و وەرگرتنی چارەسەری چڕوپڕ هەیە.

بەهەمان شێوە ڕۆژوو دەشكێنێت ئەگەر تەنگە نەفەسیەكەی وەڵامی نەبوو بۆ چارەسەری ئاسایی ، وە پێویستە ئاگاداری ئەوە بكرێت كە دابڕان لە خواردن و خواردنەوە لەو كاتانەدا دەبێتە هۆی

کەمکردنەوەی دەردراوەکانی سنگ بەشێوەیەکی بەرچاو و دواتر دەردان و فرێدانی قورس دەبێت.

**٤-دەردە باریکە (السل او التدرن الرئوي):**

ئەم نەخۆشە دەتوانێت بەڕۆژوو ببێت ئەگەر حاڵەتی گشتی باش بێت و نیشانەی نەخۆشیەکەی تیانەبێت ، بەمەرجێك دەرمانەکانی بە ڕێکوپێکی بخوات ، کە ڕۆژانە جارێك یان دووجارە ، بەلاّم لە حاڵەتی توندی نەخۆشیەکەدا وا باشترە بەڕۆژوو نەبێت تا باری گشتی نەخۆشەکە چاك دەبێت .

## شەشەم : نەخۆشیەکانی لووە ڕژێنەکان ( الغدد ) لە مانگی ڕەمەزاندا :

**کوێرە ڕژێنەکان:** ئەو کۆمەڵە ئەندامەی لەشی مرۆڤن کە تایبەتن بە دەردانی هۆرمۆنەکان و لە هەموویان گرنگتر : فرمێسکە ڕژێن ، ڕژێنی دەرەقی ، ڕژێنی سەر گورچیلەکان ، ڕژێنی تەنیشت دەرەقی ، هەردوو هێلکەدانی ئافرەت و گونی پیاو و پەنکریاس .

**١-نەخۆشیەکانی ڕژێنی دەرەقی ( الغدد الدرقیه ) :**

**أ– زۆر چالاکبوونی ڕژێنی دەرەقی:** بەهۆی دەردانی بڕی زیاتر لە هۆرمۆنی (ثایروکسین $T_4$ ) ، وە نەخۆش دەناڵێنێ بە دەست هەڵئاوسانی ڕژێنەکەی (کە دەکەوێتە خوار ملیەوە) و لاوازبوون و لەرزین و ترپە ترپی دڵەوە ، ئەگەر حاڵەتەکەی جێگیر بوو ئەوا دەتوانێت بەڕۆژوو ببێت ، بەمەرجێك دەرمانەکەی بە ڕێکوپێکی بخوات.

**ب–سستیی ڕژێنی دەرەقی:** نەخۆش دەناڵێنێ بەدەست کەم هێزی و ماندووبوونی زۆرەوە و دەتوانێت بە ڕۆژوو ببێت و لووەکانیش بە نەشتەرگەری چارەسەر دەکرێن.

**ج–هەوکردنە توندەکانی ڕژێنی دەرەقی:** زۆربەی جار ئازاری ڕژێنەکەی دەدات ، کە لەوانەیە ببێتە هۆی بەرزبی (تا) ، بەڵام

هەوكردنە درێژ خايەنەكانی ڕژێنی دەرەقی هیچ زیانێكی بۆ ڕۆژووگرتن نیە.

**٢-نەخۆشیەكانی ڕژێنەكانی سەر گورچیلەكان (امراض الغدة الكظرية):**

دوو ڕژێنن كاریان دەردانی چەند هۆرمۆنێكە لەوانە (كۆرتیزۆل ، ئەڵدوستیرۆن و هۆرمۆنەكانی زاوزێ).

نەخۆشیەكانیشیان دەگمەنن لەوانە:

**أ-نەخۆشی (كۆشینگ):**

تیایدا لاوازی لەلاشەو بەرز بوو نەوەی پەستانی خوێن ڕوودەدات ، هەروەها قەڵەوییەكی ناوەندی (ناوسك) ڕوودەدات بەبێ چوار پەلەكان ، دەم و چاوی نەخۆشەكە خڕتردەبێتەوە وە تووشی نەخۆشی شەكرە دەبێت و باش نیە كەسەكە بەڕۆژوو ببێت.

**ب-نەخۆشی (ئەدیسۆن) :**

لە ئەنجامی كەمی دەردانی هۆرمۆنی (كۆرتیزول )ەوە پەیدا دەبێت بەهۆی تێكچوونی ڕژێنەكانی سەر گورچیلەوە ، و دەبێتە هۆی دابەزینی پەستانی خوێن و كەم هێزی زۆر و گۆڕانی ڕەنگی پێست بەرەو ڕەوشی ....هتد. وە نابێت نەخۆش بەڕۆژوو بێت بە تایبەتی كاتێك كە ڕێژەی شەكری كەم بێتەوە.

ج-لووه تاريك ( الورم القتامى ) :

نەخۆشيەكى دەگمەنەو دەبێتە هۆى بەرزبوونەوەى لاسەنگى پەستانى خوێن و چەند نۆرەيەك لە ئارەقەكردنەوە و دڵە خورپێ و بێهێزى گشتى.

ئامۆژگارى نەخۆشەكە دەكرێت بە نەگرتنى ڕۆژوو ، وە نەشتەرگەرى و لابردنى ئەم لووە بە دوايدا چاكبوونەوەى تەواو دێت ، ئەو كاتيش دەتوانێت بەڕۆژوو بێت.

٣-نەخۆشيەكانى ژێر مێشكەڕژێن ( الغدد النخامية ):

چەند نەخۆشيەكى دەگمەنن لە هەموويان گرنگتر (هەڵئاوسانى چوارپەل و سەر) ، سستيى ژێرمێشكە ڕژێن ، وا باشترە ئەم نەخۆشانە بەڕۆژوو نەبن ، حاڵەتەكەشيان لەلا يەن پزيشكى پسپۆڕەوە ديارى دەكرێت .

## حەوتـــەم : نەخۆشـــیە دەمـــاری و دەروونیـــەکان لـــە مانگی ڕەمەزاندا

١- پەرکەم (الصدع) :

نەخۆشی پەرکەم دەتوانێت بەڕۆژوو ببێت بەمەرجێك دەرمانەکانی بە ڕێکوپێکی بخوات چونکە ئێستا دەرمان هەیە ڕۆژانە یەکجار دەخورێت بۆ کۆنترۆڵکردنی بێهۆشی و پەرکەم.

٢-خەمۆکی (الاکتئاب):

ئەم نەخۆشە دەتوانێت بەڕۆژو ببێت بەمەرجێك دەرمانەکانی بە ڕێکوپێکی بخوات کە ڕۆژی یەکجار یان دووجارە.

٣-لێکترازانی کەسێتی (الفصال):

نابێت ئەم نەخۆشە بەڕۆژوو ببێت چونکە نەخواردنی دەرمانەکان دەبێتە هۆی چەند ئۆرەیەك لە توندوتیژی و سەرلێشێواوی هەڵە و هەلوەسەکردن و لەوانەیە سەربکێشێ بۆ دەستدرێژیکردن بۆ سەر خەڵکی تر.

## هەشـــتەم : ئـــافرەتی ســـکپڕو شـــیردەر لـــە مانگی ڕەمەزاندا

لێکۆڵینەوە زانستیە نوێیەکان دەریانخستووە کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەبێتە هۆی گۆڕانکاری فسیۆلۆژی و کیمیایی لە ئافرەتی سکپڕدا بەڵام کاریگەریان نابێت لەسەر ئافرەتێکی سکپڕی لەش ساغ ، کە هیچ نەخۆشیەکی ئەندامیی نەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانرێت بەڕەهایی بووترێت سکپڕو شیردەر دەتوانن بەڕۆژوو بن یان نا.

بەڵام ئەگەر هەستیان بە سەر ئێشەی قورس یان تێکەڵبوونی بینین یان ماندوێتی گشتیی یان نەتوانینی هەستان بە چالاکی کرد ئەوا مانای ئەوەیە کەمبوونەوەی بەرچاو ڕوویداوە لە ڕێژەی شەکری ناو خوێنیاندا ، شتێکی نائاسایی ڕوو دەدات و دەبێت ڕاوێژ بە پزیشکی چارەسەر ساز بکەن.

### *ئەو حاڵەتە نەخۆشیانە چین کە ئافرەتی سکپڕ دەتوانێت تیایاندا بەڕۆژوو نەبێت؟*

أ-دابەزینی پەستانی خوێنی سەرەوە بۆ خوار (١٠٠ملم/جیوە) : چونکە ئەم دابەزینە دەبێتە هۆی هەستکردن بە بوورانەوە ، جگە لە لەدەستدانی توانای ئاگایی.

ب–ڕشانەوەی کاتی سکپڕبوون : بەتایبەتی لە سێ مانگی یەکەمی سکپڕیدا.

ج–ژەهراوی بوونی کاتی سکپڕی : کە تیایدا خوێن بەرز دەبێتەوە ، وە پرۆتین لە میزدا دەردەکەوێت و لە پەلەکانیشدا ڕوو دەدات.

و–دابەزینی ڕێژەی شەکر لە خوێندا.

ه–بوونی نەخۆشیەکی ئەندامیی لە ژێر سەرپەرشتی پزیشکێکی چارەسەرسازیدا.

بە کورتی : بابەتی ڕۆژووگرتنی ئافرەتی سکپڕ لە مانگی ڕەمەزاندا پابەندە بە حاڵەتی دایکەکە و کۆرپەلەکەی لە پێش مانگی ڕەمەزاندا ، خۆ ئەگەر هەموو نیشانە و شیکاریە سەرجێییەکان نیشانیاندا کە تەندروستیان باشە ، ئەوا بە زۆریی پزیشك ڕێ بەدایکەکە دەدات بەڕۆژوو ببێت ، کە بڕیاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پزیشکی (ئافرەت) یان پزیشکی (پیاوی ) تایبەتمەندی موسوڵمان.

## نۆیەم : شیرپێدان و ڕۆژووگرتن

ئافرەتی شیردەر دەتوانێت مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت بەمەرجێك قەرەبووی شیرەکە بکاتەوە بە خواردن و خواردنەوە لە کاتی شەودا ، هەروەها جۆر و بڕی شیرەکە کاریگەری نەبێت لەسەر منداڵە شیرەخۆرەکە . بەڵام ئەگەر دایکەکە لە تەندروستی خۆی یان منداڵەکە ترسا بەهۆی ڕۆژووگرتنەوە ئەوا دەتوانێت بەڕۆژوو نەبێت.

**بەکورتی:** ناتوانرێت بڕیارێکی گشتی دەربکرێت بۆ هەموو نەخۆشەکان بەڵکو دەبێت هەر نەخۆشێك بە جیا لێی بکۆڵرێتەوە ، ئەم کارەش تەنها بە پزیشکێکی موسوڵمانی تایبەتمەند دەکرێت چونکە ئەوەندەی پێدراو پێیە کە بتوانێ ئامۆژگاری نەخۆشەکەی بکات بە گرتن و نەگرتنی ڕۆژوو .

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

د.حسان شمسي پاشا

**نوسەر لە چەند دێڕێکدا :**

ناو : حسان شمسي پاشا

ساڵ و شوێنی لەدایك بوون : ١٩٥١ ز ، شاری (حمص)ی وڵاتی سوریا.

ئاستی خوێندن : ساڵی ١٩٧٥ کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی (حلب) تەواوکردووە.

دواتر بۆ خوێندن چەندەها وڵاتی تر گەڕاوە و بۆتە هاوڕێی چەندەها زانکۆی ناوداری جیهانی بە تایبەتی بەریتانی و ئەمریکی.

